# دڵۆپێک

له جیاوازی نێوان مه‌نهه‌جی سه‌له‌ف و معاصرین له حدیثدا

نوسین و ئاماده‌کردنی: کاروان کمال الکردي

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب:** دڵۆپێک لە جیاوازی نێوان مەنهەجی سەلەف و معاصرين لە حديثدا

**نوسين و لێکۆڵینەوەی:** کاروان کمال الكردي

**دیزاینی ناوەوە** : پەرجان دۆسکی

ژمارەی پەڕە: ١٥٥

ساڵ: ١٤٤٣هـــ

ناونیشانی کەناڵ لە تەلەگرام

https://t.me/karwankamall١

# دڵۆپێک

## لە جیاوازی نێوان مەنهەجی سەلەف

## و معاصرین لە حدیثدا

نوسین و ئامادەکردنی:

کاروان کمال الکردي



# پێشەکی

## بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيم

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّمَ أما بعد:

**عمرو بن علي** ( الفلاس ) دەڵێت : بۆی باسکردم عفان ( بن مسلم ) گووتی: ئێمە لای[ إسماعیل ابن علیة ] بووین ، یەکێک فەرموودەیەکی گێڕاوە لە کەسێك منیش ( عفان ) گووتم : فەرموودە لەو کەسە مەگێڕەوە چونکە ئەوە ( جێگیر ) (ثبت) نیە ،

گووتی : تۆ غەیبەتت کرد ،( إسماعیل ) گووتی : نەخێر غەیبەتی نەکرد بەڵکو حوکمی داوە بەسەری بەوەی جێگیر نیە.

قال الكردي : ئەوە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی کەوا دەڵێن نابێ بەهیچ جۆرێ ڕەخنە لە زانایان بگیرێ یان باسیان بکرێ یان هەڵەکانیان بخرێتە ڕوو ، وە بەمانەیەکی باسکردنی حاڵی ( زانایەك ) لە بابێک کەوا نەیپێکاوە هەرگیز بەمانای غەیبەت نایەت .

عمرو بن علي الصيرفي دەڵێ : گوێم لە  يحيى بن سعيد القطان بوو دەیگووت : پرسیارم کرد لە سفيان الثوري و شعبة بن الحجاج ومالك بن أنس و سفيان بن عيينة دەربارەی پیاوێك کەوا جێگیر نیە لە فەرموودە دا ،

پیاوێک دێ و پرسیارم دەربارەی دەکات لێی ، هەموویان گووتیان حاڵی ڕوون بکەوە.

قال الكردي : سەنەدی متصل و لەچەندین کتوبی الجرح والتعديل هاتووە ، هەروەها ئەو ریوایەتە دەبێتە کۆدەنگی پێشەوایانی سەلەف ، چونکە سفيان الثوري پێشەواو سەرمەشقی ئەهلی کوفە بوو وە مالك بن أنس ئیمامی دار الهجرة بوو وە شعبة بن الحجاج پێشەواو ئیمامی ئەهلی بەسڕە بوو وە ابن عيينة چل ساڵ ئیمامی قەومێك بوو . بۆیە ئەو جۆرە گواستنەوانە دەبنە کۆدەنگی ئەهلی علم ، کەواتە پێشەوایانی سەلەف متفق بوون لەسەر ئەوەی کەوا گەر کەسێك لە حديث دا( جێگیر نەبێ ) پێویستە حاڵی بۆ خەڵك ڕوون بکرێتەوە ،

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەو باسە ئەو بابە دەبینین زانایان قسەیان لەسەر دەیان پێشەوای ئوممەت کردووە کەوا عابد بوون وەك ( سيف بن هارون البرجمي) کەوا کەسێکی زاهید و لەخوا ترس بووە( ابن عدي الجرجاني ) لە ترجمەی ژیانی دا هێناویەتی کەوا گۆڕێکی هەڵکەند بوو لەماڵەکەی هەموو ڕۆژ جارێک دەڕۆیشتە ناویەوە و دەیگووت : دامپۆشن ئینجا لەترسا هاواری دەکرد



و دەیگووت : رب ارجعون ، بەڵام ، سەرەڕایی ئەوە سەلەف متفق بوونە لەسەر (تضعیف ) کردنی ، کەس نەهات دواتر لۆمەیان بکات.

لەژێر ئەو ڕۆشنایەیی سەلەفدا کە پێمان گووتراوە ئەگەر راویەك حاڵی باش نەبوو ئەوا پێویستە بۆ خەڵك ڕوونبکرێتەوە.

(بەندە) دوای دیراسە و تحقیق و ووربوونەوە لە نزیکەی ١٥٠٠٠ پانزە هەزار فەرموودە لەسنن ەکان و بەراود پێکردنیان و پێوانە کردنی لێکۆڵینەوەی هەندێ لە ( محقق و محدثة ) کانی سەردەم وەك ( أحمد محمد شاكر و محمد نا صرالدين الألباني و محمد بن صبحي الحلاق ) بەتەرازووی پێشەوایانی سەلەف بینیم و تێبینم کرد کەوا ( لادان و مخالەفە) زۆر کراوە لەلایەن ئەو لێکۆڵەرەوانەی سەردەم بەبەراورد بە پێشەوایانی سەلەف ، بەتایبەت کاریگەرترینیان بۆ (عەوام ) لێکۆڵینەوەکانی ( الألباني)،

کەوا زۆرترین لێکۆڵینەوەی لە زۆر ترین کتوبەکاندا کردووە ، بەڵام ، زۆرترین لادان و مخالەفەی مەنهەجی سەلەف و ئەو قەواعیدەی دایاننناوە ، لێرەدا من هاتووم دەیان سەنەدم هێناوە لە یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی ئوممەت ,ئەویش ( سنن الترمذی)

چونکە جۆرە غەدرێکی ڕوون و ئاشکرا لەو پێشەوا بەڕێزە کراوە بەوەی گوایە (متساهلە ) بێگوومان زۆرینەی زۆری ئەوەی ئەو قسە (دەڵێتەوە ) بۆیە دەڵێم



(دەڵێتەوە ) چونکە قسەی خۆی نیە بەڵکو گووتراوێکە و لە کتێبێک چاوی پێکەوتووە ، کە خاوەنەکەی ( الذهبي ) ە ، گوومانتان نەبێ هەریەك بچێت بەووردی ئەو کتێبە بخوێننەوە و دواتر ( منصف ) تێدەگات بەڵێ ئەو ئیمامە ستەمی لێکراوە چونکە لەلووتکەی اتقان و ووردی دابووە ، بەجۆرێک تاکە کتێبە لەهەموو ئوممەت بەو شێوە گشتی و فراوانە تحقیق و تخریج و تدقیق و تعلیل ی فەرموودەکان بکات ،

من هاتووم بۆنمونە ٧٠ فەرموودەم هێناوە کەوا لەسنن الترمذي

محققەکانی سەردەم تەحقیقیان کردووە و لەبەرامبەریشدا (ئیمامی أبو عیسی الترمذي ) تحقیقی کردووە بەووردی ، دەبینرێ سەدا ٩٨ ی تەحقیقی ئیمامی الترمذي پێکاوترە لە وانی تر ، ئەو ڕێژەیە ئەوە نیە بڵێین لەهەموو سنن الترمذي بێت، نەخێر بەڵکو لە کەمتر لە ٢٠٠٠ حدیث جگە لەوە من وازم لە عەنعەنەی مدلسین هێناوە کەوا گوێیان پێنەداوە دەیان ڕاوی [مختلف فیە] و (فیە مقال ) کە فەرموودەکانیان تصحیح کراوە لەلایەن معاصرین واتە ئەگەر بێت و لەو ڕێژە ئەوانەشم بهێنایە ئەوا بەسەدان فەرموودە دەبوو ، بەڵام ، زیاتر مرسل و منقطع و مجهول و ضعیف و منکر ەکانم هێناوە ، هەروەها ئەو بەراورد کاریە گەورەترین بەراورد کاریە لەنێوان مەنهەجی سەلەف و مەنهەجی سەردەم ، بەیارمەتی الله بۆخوێنەر دەردەکەوێ کەوا بەڵێ زانا سەردەمیەکان زۆر دوور بوون لە صواب بەڵکو هەمیشە ئەهلی پێکان سەلەف بوون.



هەروەها ئەو بەراورد کاریە لەنێوان مەنهەجی سەلەف و خەلەف لێرەدا تەنها لەو کتێبەی ئیمامی الترمذیە وە تەنها لەڕووی سەنەدەوە واتە هەندێ لەو سەنەدانە بە ڕێگای تر هاتوون کەوا سەنەدیان باشە زۆرێکیان ئاماژەم پێداوە،

لەکۆتاییەکاندا هەندێ فەرموودەمان داناوە کەوا لە ڕووی ( العلل ) پێشەوایانی سەلەف بەلاوازیان داناوە ، بەڵام ، الألباني و ئەتباعیان بە صحیح یان داناوە ،

بۆنمونە : من سەنەدێکم لە سنن الترمذي هێناوە بەژمارەوە

ئینجا تەحقیقی ئەلباني و محمد و شاکرم لەلایەك داناوەبەکورتی دەڵێم : ئەلبانی و محمد بن صبحي و احمد شاكر دەڵێن: صحیح

الترمذي دەڵێت : غریب یان حسن.

هەروەها هاتووم مصطلحاتي ئیمامی الترمذي م شیکردۆتەوە مەبەستی چیە و بۆ چیە واتە لەو لایەنەوە سوودێکی چاکی هەیە بۆ خوێنەر چونکە لەوە دەگات مەبەستی پێشەوا أبوعیسی چیە لە( حسن ) لەبەرئەوەی زۆرینەی زۆری تائێستاش وادەزانێ کە مانای ( حسن ) لای ئیمامی الترمذي هەمان ئەو مانایەیی ئێستایە کە بۆ حسن دایانناوە ، نەخێر بەڵکو بەچەندان بەڵگە لەو سەنەدانە ئەوە دەسەلمێنین کەوا ئیمام کاتێ تحسینی فەرموودەیەکی کردووە دواتر هەر خۆی تضعیفي دەکات لەڕیوایەتی تر وە هەموو ئەو سەنەدانەوە کەوا پێشەوا الترمذي



بە ( حسن ) ی داناوە ئیللا سەنەدی[ فیە مقال ] ە.

هەروەها من تەنها لەپێناو پاراستن و بەرگری لە سووننەت ئەو کارە پیرۆزەم کردووە گەر نا هیچ ئامانجێکم نیە وە عەداوەی شەخسیم لەگەڵ هیچ کەس نیە ، بەڵکو ئەوە کاری منە وەك {محقق و محدث} و شوێنکەوتەی مەنهەجی سەلەف ، وەك لەسەرەوە باسم کرد دوای لێکۆڵینەوە لە زیاتر لە ١٥٠٠٠ هەزار فەرموودە لە سنن جگە لە سەدان و سەدان فەرموودەو آثري تر لە کتوبەکانی تر ئینجا گەیشتووم بەو قەناعەتە هەروەها بەڵگەم هێندە زۆرە وەك کەفی دەریایە بەڵام ، ئەوەندە کافیە بۆ خوێنەر تا تێبگات جیاوازی نێوان مەنهەجی سەلەف و خەلەف {كما بين المشرق والمغرب}

داواکارم الله عزوجل بۆمان بکاتە توویشووەك و لێمان قبوڵ کاتن

بەندەی هەژار : **کــاروان بن كمال بن إسماعيل الكردي**.







# كتاب الطهارة



أَبْوَابُ : الطَّهَارَةُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ا بَابٌ : فِي الِاسْتِتَارِ عِنْدَ الْحَاجَةِ . ح ١٤

## فەرموودەی ١:

عَنْ أَنَسٍ قَالَ : كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ لَمْ يَرْفَعْ ثَوْبَهُ حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الْأَرْضِ.

الألباني و محمد بن صبحي دەڵێن : صحيح

الترمذي دەڵێت : بە معلول بالإرسال داناوە .

١ :دەڵێم [ الكردي ] ئەو فەرموودە أبو داود هێناویەتی لە ڕێگای {الأعمش عن رجل عن ابن عمر } وە دواتر أبوداود تضعيفي ريوايەتی عبدالسلام بن حرب عن الأعمش عن أنس دەكات .



٢ :وە ئیمامی الدارمی هێناویەتی لە (عبدالسلام بن حرب عن الأعمش عن أنس عن النبي )

دەڵێم : ئەو فەرموودە دوو عیللەی تێدایە ئەوانیش :

١ :الأعمش مدلسە وە لێرەشدە بە ( عن ) فەرموودەی گێڕاوەتەوە

٢ :گوێی لە ( أنس بن مالك ) نەبووە هەریەك لە پێشەوایانی وەك ( يحيى بن معين و احمد بن حنبل و علي ابن المديني و الترمذي ) وادەڵێن.

١ :ئیمامی الترمذي دەڵێت پرسیارم کرد لە محمد بن إسماعيل البخاري لەبارەی ئەو فەرموودانەوە پێم گووت کامیان ڕاستترن ؟ فەرمووی : كلاهما مرسل . واتە هەردووکیان مرسلن.

٢ :وە ئیمامی الترمذي دەڵێت : وَكِلَا الْحَدِيثَيْنِ مُرْسَلٌ، واتە هەردوو ریوایەتی أنس و ابن عمر معلوله بالإرسا.

لەکۆتاییدا : ئەو فەرموودە بەلاواز دانراوە لەلایەن پێشەوایانی سەلەفی وەك:

١ :محمد بن إسماعيل البخاري

٢ :أبو داود السجستاني



٣ :أبو عيسى الترمذي

٤ :أبو الحسن الدارقطني





## فەرموودەی : ٢

أَبْوَابٌ : الطَّهَارَةُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ | بَابٌ : مَا جَاءَ فِي تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ .

سنن الترمذي

أَبْوَابٌ : الطَّهَارَةُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بَابٌ : مَا جَاءَ فِي تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ

٢٩ ١ : ٨٠ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ ، قَالَ : حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ ، عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ بْنِ أَبِي الْمُخَارِقِ أَبِي أُمَيَّةَ ، عَنْ حَسَّانَ بْنِ بِلَالٍ قَالَ : رَأَيْتُ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ تَوَضَّأَ فَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ، فَقِيلَ لَهُ - أَوْ قَالَ : فَقُلْتُ لَهُ - : أَتُخَلِّلُ لِحْيَتَكَ ؟ قَالَ : وَمَا يَمْنَعُنِي وَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ ؟

سنن ابن ماجه: ٤٢٩,الألباني و محمد بن صبحي و شعيب و شاكر دەڵێن : صحيح.



بەڵام ئیمامی الترمذي تضعيفي كرديه وه دەڵێت : قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ : لَمْ يَسْمَعْ عَبْدُ الْكَرِيمِ مِنْ حَسَّانَ بْنِ بِلَالٍ حَدِيثَ التَّخْلِيلِ

جگە لەوەش عَبْدِ الْكَرِيمِ بْنِ أَبِي الْمُخَارِقِ أَبِي أُمَيَّةَ .

سەلەف و خەلەف متفق بوونه له تضعيف كردنی وه هەندێکیان

به متروکیان داناوه وەك : احمد بن حنبل و النسائي و الدارقطني .





## فەرموودەی : ٣

بَابٌ : مَا جَاءَ أَنَّ الْأُذُنَيْنِ مِنَ الرَّأْسِ :

٨٦ حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ ، قَالَ : حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ ، عَنْ سِنَانِ بْنِ رَبِيعَةَ ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ : تَوَضَّأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؛ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَيَدَيْهِ ثَلَاثًا، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَقَالَ : " الْأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ ". قَالَ قُتَيْبَةُ : قَالَ حَمَّادٌ : لَا أَدْرِي هَذَا مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ مِنْ قَوْلِ أَبِي أُمَامَةَ.

الألباني و محمد بن صبحي و شاكر و شعيب دەڵێن: صحيح

بەڵام ئیمامی الترمذي دەڵێت : حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ الْقَائِمِ واتە بەلاوازی داناوە.

دەڵێم : ئەو سەنەدە دوو عیللەی بریتین لە :



١ :(سِنَانِ بْنِ رَبِيعَةَ ) فيه مقال هەریەك لە :

أبو حاتم الرازي و الدارقطني دەڵێن : (مضطرب الحديث)

٢ :(شهر بن حوشب ) فيه مقال وثقه بعض و ضعفه بعض.







# كتاب الوتر

## فـەرموودەی : ٤

بَابٌ : مَا جَاءَ مَا يُقْرَأُ فِي الْوِتْرِ .

٤٧٨ حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ الْبَصْرِيُّ ، قَالَ : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ الْحَرَّانِيُّ ، عَنْ خُصَيْفٍ ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ قَالَ : سَأَلْنَا عَائِشَةَ : بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَتْ : كَانَ يَقْرَأُ فِي الْأُولَى بِـ { سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى } . وَفِي الثَّانِيَةِ بِـ { قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ } . وَفِي الثَّالِثَةِ بِـ { قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ } ، وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ.

ئەلبانی دەڵێت : صحيح .

وە لەسنن ابن ماجە بەژمارە ١١٧٣ هاتووە بەهەمان سەنەدی سنن الترمذي ،لەوێشدا ئەلبانی دەڵێ : صحيح .

ئیمامی الترمذي دەڵێت :وهذا حديث حسن غريب .واتە تضعيفي ئەو ڕیوایەتە دەکات .



قال الكردي : ئەو سەنەدە سێ عیللەی تێدایە لە سەنەدی :

یەکەمیان : [ خصيف بن عبدالرحمن الجزري ] تێدایە ،فيەمقال .

علي ابن المديني دەڵێت : يحيى بن سعيد ، بەلاوازی دادەنا.

وە هەریەك لە : ئەحمد بن حنبل وە أبو داود دەڵێن : مضطرب الحديث

وە ئیمامی النسائي لە الضعفاء دەڵێ : ليس بالقوي،

وە ابن حبان لە المجروحين جرحی دەكات ،

وە الدارقطني قسەی لەسەر كردووە ،

بەڵام ، هەریەك لە يحيى بن معين وە ابو حاتم دەڵێن : صالح

وە أبوزرعة الرازي دەڵێ : ثقة .

دەڵێم ، لە تضعيف نزيكترە وەك لە توثيق .

دووەمیان : {عبدالعزيز بن جريج القرشي}

ئیمامی البخاري و العقيلي دەڵێن : لايتابع في حديثه و على حديثه .

وە البرقاني لە سؤالاتی لە الدارقطني دەڵێ : مجهول.

سێیەمیان : ( منقطعة ) چونكە عبدالعزيز گوێی لە عائشة نەبووە.



هەریەك لە العجلي لە الثقات و ابن حبان لە الثقات وە الدارقطني دەڵێن : لم يسمع من عائشة .

وە الدارقطني دەڵێت : يترك هذا الحديث .

فسبحان الله سەنەدێك هێندە نەخۆشی تێدابێت چۆن شایستەی ئەوەیە بەڕاست دابنرێت.



## فەرموودەی ٥

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَنَامُ عَنِ الْوِتْرِ أَوْ يَنْسَاهُ.

٤٨٠ حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ ، قَالَ : حَدَّثَنَا وَكِيعٌ ، قَالَ : حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنْ نَامَ عَنِ الْوِتْرِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَ وَإِذَا اسْتَيْقَظَ "

ئەلبانی دەڵێت : صحيح.

ئیمامی الترمذي بێدەنگ بووە لێی بەڵام ، لە فەرموودەی دواتر بەژمارە ٤٦٥ تضعيفي دەكات.

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە [عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ] ضعيف

پێشەوایانی سەلەف بەو شێوە قسەیان لەسەر کردیە :

يحيى بن معين وە احمد بن حنبل وە أبو زرعة الرازي وە أبو داود وە النسائئ وە الدارقطني دەڵێن : ضعيف

وە البخاري لە [ الضعفاء ] دەڵێت : گوێم لە علي ابن المديني بوو زۆر بەتووندی جرح ی دەكرد واتە تضعيف .

وه ابن سعد وه ابن خزيمة وه ابن حبان له المجروحين ده‌ڵێن : ضعيف .

ته‌نانه‌ت له متأخرين وه‌ك : الذهبي و ابن حجر ده‌ڵێن : ضعيف

واته كۆده‌نگی زانایان له‌سه‌ریه‌تی .



## فەرموودەی ٦

بەهەمان شێوەی سەرەوە ئەلبانی دەڵێت : صحیح

ـوە ئیمامی الترمذي دەڵێت : وهذا أصح من الحديث الأول. سمعت أبا داود السجزي يعني سليمان بن الأشعث يقول : سألت أحمد بن حنبل عن عبد الرحمن بن زيد بن أسلم، فقال : أخوه عبد الله لا بأس به. وسمعت محمدا يذكر عن علي بن عبد الله أنه ضعف عبد الرحمن بن زيد بن أسلم وقال : عبد الله بن زيد بن أسلم ثقة .

لێرەدا أبو عیسی ، ئەو ڕیوایەتەی بەسەر ئەویتر هەڵبژارد واتە ٤٦٥ ، وە نەقڵی ئەقوالی ئەئمەی سەلەف دەکات لەسەر ، تضعیف کردنی (عبدالرحمن بن زید بن اسلم)

قال الكردي: ئەوەش مانای ئەوە نیە ئەو سەنەدەی تصحیح کردبێ

چونکە عیللەتێکی تێدایە ئەویش [ زيد بن أسلم ] تابعیە ، بۆیە گوێی لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەبووە ، واتە ئەو ڕیوایەتە ، {مرسلە}



# فەرموودەی ٧

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ التَّسْبِيحِ

٤٩٢ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو وَهْبٍ قَالَ : سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْمُبَارَكِ عَنِ الصَّلَاةِ الَّتِي يُسَبَّحُ فِيهَا، فَقَالَ : يُكَبِّرُ ثُمَّ يَقُولُ : سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ، ثُمَّ يَقُولُ - خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً - : سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَتَعَوَّذُ وَيَقْرَأُ : بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَفَاتِحَةَ الْكِتَابِ، وَسُورَةً، ثُمَّ يَقُولُ - عَشْرَ مَرَّاتٍ - : سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَرْكَعُ فَيَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ يَسْجُدُ فَيَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ يَسْجُدُ الثَّانِيَةَ فَيَقُولُهَا عَشْرًا، يُصَلِّي أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ عَلَى هَذَا، فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ تَسْبِيحَةً فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، يَبْدَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِخَمْسَ عَشْرَةَ تَسْبِيحَةً، ثُمَّ يَقْرَأُ، ثُمَّ يُسَبِّحُ عَشْرًا، فَإِنْ صَلَّى لَيْلًا فَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يُسَلِّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، وَإِنْ صَلَّى نَهَارًا فَإِنْ شَاءَ سَلَّمَ وَإِنْ شَاءَ لَمْ يُسَلِّمْ. قَالَ أَبُو وَهْبٍ : وَأَخْبَرَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي رِزْمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ قَالَ : يَبْدَأُ فِي الرُّكُوعِ بِسُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، وَفِي السُّجُودِ بِسُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى ثَلَاثًا، ثُمَّ يُسَبِّحُ التَّسْبِيحَاتِ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ : وَحَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ زَمْعَةَ قَالَ : أَخْبَرَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ - وَهُوَ ابْنُ أَبِي رِزْمَةَ - قَالَ : قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ



الْمُبَارَكِ : إِنْ سَهَا فِيهَا يُسَبِّحُ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ عَشْرًا عَشْرًا، قَالَ : لَا إِنَّمَا هِيَ ثَلَاثُمِائَةِ تَسْبِيحَةٍ.ئەلبانی دەڵێت : صحيح ، وە لە سنن ابن ماجه هاتووە بەژمارە ١٣٣٦ بەهەمان سەنەد ، وە لەوێشدا تصحيحي كرديه .

ئیمامی الترمذي : هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي رَافِعٍ.

واته ضعيف.

دەڵێم : ئەو فەرموودە لە ڕووی سەنەدەوە دوو عیللەی تێدایە:

یەکەمیان : ( موسى بن عبيدة اليماني ) فيه مقال وە لەپێشەوایانی سەلەف بەو شێوە قسەیان لەسەر کردووە :

يحيى بن سعيد القطان وە يحيى بن معين وە علي ابن المديني

و أبو زرعة الرازي و أبو داود السجستاني و النسائي و الدارقطني و الترمذي دەڵێن : ضعيف .

أحمد بن حنبل وە أبو حاتم الرازي و الساجي دەڵێن : منكر الحديث .

عیللەی دووەمیان :سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ . مجهول .







# كتاب الْجُمُعَةِ



## فەرموودەی : ٨

بَابٌ : فِي اسْتِقْبَالِ الْإِمَامِ إِذَا خَطَبَ .

**كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى الْمِنْبَرِ اسْتَقْبَلْنَاهُ بِوُجُوهِنَا .**

ئەلباني و محمد بن صبحي دەڵێن : صحيح .

ئیمامی الترمذي دەڵێت : وَحَدِيثُ مَنْصُورٍ لَا نَعْرِفُهُ إِلَّا مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ الْفَضْلِ بْنِ عَطِيَّةَ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْفَضْلِ بْنِ عَطِيَّةَ ضَعِيفٌ ذَاهِبُ الْحَدِيثِ عِنْدَ أَصْحَابِنَا . واتە ضعيف .

وە دەڵێت : وَلَا يَصِحُّ فِي هَذَا الْبَابِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْءٌ. واتە هیچ فەرموودەیەکی صحیح لە پێغەمبەرەوە نەهاتووە تایبەت بەو باسە .

دەڵێم : [ مُحَمَّدُ بْنُ الْفَضْلِ بْنِ عَطِيَّةَ ] متهم و ضعيفة

هەریەك لە : احمد بن حنبل وە يحيى بن معين وە ابو حاتم الرازي و الجوزجاني والفلاس دەڵێن : ضعيف و حديثه حديث اهل الكذب وە هەندێكيان دەڵێن : كذاب .

وە البخاري و مسلم و ابو زرعة الرازي و النسائي و الدارقطني

هەموويان دەڵێن : متروك .

فسبحان الله سەنەدێک بەو شێوە بێت چۆن بەچ شێوەیەك تصحيح دەكرێت .

قال الكردي :

لە سنن ابن ماجه بەسەنەدی تر هاتووە بەژمارە ١١٣٦

كِتَابٌ : إِقَامَةُ الصَّلَاةِ وَالسُّنَّةُ فِيهَا. ا بَابٌ : مَا جَاءَ فِي اسْتِقْبَالِ الْإِمَامِ وَهُوَ يَخْطُبُ .

بەڵام لە سەنەدی : [ ثابت الأنصاري ) تێدایە ،

ئیمامی البخاري دەڵێت : لايتابع عليه .

وە أبو الحسن الدارقطني لە سؤالاتی البرقاني لێی : ضعيف.

وە تەنانەت لە متأخرين ابن حجر لە تقريب دەڵێ : مجهول .






# كتابُ الْعِيدَيْنِ



## فەرموودەی : ٩

بَابٌ : فِي الْمَشْيِ يَوْمَ الْعِيدِ .

**مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تَخْرُجَ إِلَى الْعِيدِ مَاشِيًا، وَأَنْ تَأْكُلَ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ .**

ئەلبانی دەڵێت : حسن .

ئیمامی الترمذي دەڵێت : حسن ، وەك معلومە حسن لای ئەو وەك سەردەمی معاصر نیە .

قال الكردي : ئەو فەرموودە لەڕووی سەنەد دووعیللەی تێدایە

یەكەمیان : شريك بن عبدالله النخعي ] فيه مقال و سيء الحفظ و مدلس ، وە لێرەشدا معنعنە .

دووەمیان : [ الحارث بن عبدالله الهمداني ] ضعيف



سەلەف بە لاوازیان داناوە بەو شێوەیە:

يحيى بن سعيد القطان : فەرموودەکانی واز لێهێناوە.

علي ابن المديني دەڵێت : الحارث الكذاب .

هەریەك لە ، أبو حاتم الرازي و أبوزرعة الرازي و النسائي و الدارقطني دەڵێن : ضعيف .

دەڵێم : لەڕێگای تر ابن ماجه لە سنن هێناویەتی بەسێ ڕیوایەت بەڵام هەرسێکیان لاوازن ، یەکێکیان ، متروک و ئەویتر مجهول یەکێکیان بەهەمان سەنەدی الترمذي هێناوە .





## فەرموودەی : ١٠

بَابٌ : فِي التَّكْبِيرِ فِي الْعِيدَيْنِ .

**عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَبَّرَ فِي الْعِيدَيْنِ : فِي الْأُولَى سَبْعًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ وَفِي الْآخِرَةِ خَمْسًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ.**

ئەلباني و محمد بن صبحي هتد . دەڵێن : صحيح .

الترمذي دەڵێت : حسن .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە {كثير بن عبدالله بن عمر بن عوف}

سەلەف بە لاوازیان داناوە و جرحیان کردیە بەو شێوە :

يحيى بن معين و علي ابن المديني و ابو حاتم الرازي و ابو زرعة الرازي و الجوزجاني دەڵێن :. ضعيف .

احمد بن حنبل و ابن حبان دەڵێن : منكر الحديث .

وە النسائي و الدارقطني دەڵێن : متروك.

وە ابن عبدالبر دەڵێ : مجمع على ضعفه .



واتە کۆدەنگ بوون لە جرح و بەلاواز دانانی بەڵام ، لای معاصر ئەو شتە نایخوات .








# كتاب السفر



## فەرموودەی : ١١

بَابٌ : ذِكْرُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الْجُلُوسِ فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ ". قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ ."

الألباني و محمد بن صبحي و هتد دەڵێن: حسن.

الترمذي دەڵێت : هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( هلال بن أبي هلال ,أبي ظلال )تێدایە

پێشەوایانی سەلەف جرحیان کردووە بەم شێوەیە :



يحيى بن معين و أبو حاتم الرازي وأبو داود السجستاني و النسائي و ابن عدي الجرجاني و ابن حبان دەڵێن : ضعيف .

ئەم فەرموودە ئیمامی الترمذي لە كتب التسعة بەو سەنەدە بەتەنها هێناویەتی وە خۆشی دەڵێ غريب واتە هەموو ڕێگاكان دەچێتەوە سەر أبو ظلال واتە هیچ ڕێگایەکی صحيح نیە ،

بەڵام دانیشتنی دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵات سوننەتەو ئیمامی مسلم فەرموودەی لەسەر هێناوەتەوە ، بەڵام بەو لەفظة نەهاتووە والله اعلم .









# كتاب الزَّكَاةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ١٢

بَابٌ : لَا زَكَاةَ عَلَى الْمَالِ الْمُسْتَفَادِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ .

**قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنِ اسْتَفَادَ مَالاً فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ**

ئەلبانی دەڵێت : صحيح

الترمذي بێدەنگ بووە لێی بەڵام لە فەرموودەی دواتر تضعيفي دەكات .





## فەرموودەی : ١٣

٦٣٢ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ ، قَالَ : حَدَّثنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ ، قَالَ : حَدَّثنَا أَيُّوبُ ، عَنْ نَافِعٍ ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، قَالَ : مَنِ اسْتَفَادَ مَالاً فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ،ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح .

ئیمامی الترمذي دەڵێت : وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، وَرَوَاهُ أَيُّوبُ، وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ مَوْقُوفًا، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ضَعِيفٌ فِي الْحَدِيثِ ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَعَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُهُمَا مِنْ أَهْلِ الْحَدِيثِ، وَهُوَ كَثِيرُ الْغَلَطِ.

واتە ئەو ڕیوایەتەی هەڵبژاردووە بەسەر ڕیوایەتی ٦٣١ چونکە دەڵێت : وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ضَعِيفٌ فِي الْحَدِيثِ ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَعَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُهُمَا مِنْ أَهْلِ الْحَدِيثِ، وَهُوَ كَثِيرُ الْغَلَطِ .

عبدالرحمن بن زيد ، ضعيف ، پێشووتر قسەمان لەسەری کردووە ، وە ئەو ڕیوایەتە صحيحة بەڵام موقوفە واتە قەولی هاوەڵانە نەك مرفوع بێت لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم .



سبحان الله لە گەورەیی و زیرەکی ئەو ئیمامە بەڕێزە ، چەند وورد بووە لە تحقیق و تخریج ، بەپێچەوانەی ئەمڕۆ.

## فەرموودەی : ١٤

بَابٌ : الْكَنْزُ، مَا هُوَ ؟ وَزَكَاةُ الْحُلِيِ ؟

**أن امرأتين أتتا رسول الله صلى الله عليه وسلم وفي أيديهما سواران من ذهب، فقال لهما : " أتؤديان زكاته ؟ ". قالتا : لا. قال : فقال لهما رسول الله صلى الله عليه وسلم : " أتحبان أن يسوركما الله بسوارين من نار ؟ ". قالتا : لا. قال : " فأديا زكاته ."**

الألباني و محمد بن صبحي و هتد دەڵێ : حسن.

الترمذي دەڵێت : ولا يصح في هذا الباب عن النبي صلى الله عليه وسلم شيء.

واتە هیچ فەرموودەیەکی صحیح نیە لە پێغەمبەرەوە لەسەر ئەو باسە.



دەڵێم: ئەو سەنەدە دوو عیللەی تێدایە :

یەکەمیان : ( ابن لهیعة ) سەلەف و متأخرین متفق بوونە لەسەر تضعیف کردنی .

دووەمیان : ریوایەتی {عمرو بن شعیب عن ابیه عن جده}

فیه مقال . والله اعلم.





## فەرموودەی : ١٥

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الْخَضْرَاوَاتِ .

مەتنی فەرموودە : {**عن معاذ ، أنه كتب إلى النبي صلى الله عليه وسلم يسأله عن الخضراوات وهي البقول، فقال : " ليس فيها شيء**}

ئەلباني و محمد بن صبحي و أتباعيان دەڵێن : صحيح

الترمذي دەڵێت : هذا الحديث ليس بصحيح .

دەڵێ ئەو فەرموودەیە صحیح نیە ، دواتر دەڵێت :وليس يصح في هذا الباب عن النبي صلى الله عليه وسلم شيء .

واتە هیچ فەرموودەیەکی مرفوع نیە صحیح بێ لەو بابە .

دواتر دەڵێ :وإنما يروى هذا عن موسى بن طلحة، عن النبي صلى الله عليه وسلم مرسلا. واتە ئەوەی هەیە مرسلە .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( الحسن بن عمارة البجلي ) تێدایە

متروکە ، پێشەوایانی سەلەف بەتوندی جرحیان کردووە وەك :



شعبة بن الحجاج دەڵێ : كذاب

وه هەريەك لە ئەحمەد بن حنبل وه عمروبن علي الفلاس و ابو حاتم الرازي و النسائي و الدارقطني و ابن حبان وه يعقوب بن شيبة دەڵێن: متروك .

وه الترمذي دەڵێ : ضعفه شعبة و تركه ابن المبارك .

جگەلەوانەش العجلي و ابوزرعة الرازي و زۆرێكی تر .

سبحان الله سەنەدێك بەوشێوه بێ چۆن حەقی تصحيح كردنی هەيه.





## فەرموودەی: ١٦

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ .

**قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " المعتدي في الصدقة، كمانعها ."**

ئەلباني و محمد بن صبحي دەڵێن : حسن

الترمذي دەڵێت : حديث أنس حديث غريب من هذا الوجه. وقد تكلم أحمد بن حنبل في سعد بن سنان.

غريب واتە ضعيف هەم لەڕووی مەتن هەمیش لەڕووی سەنەد، وە هۆکاری ضعفەکەی دیاری کردیە ئەویش ( سعد بن سنان).

دەڵێم : [ سعد بن سنان الكندي ] ضعيف.

أحمد بن حنبل دەڵێ : مضطرب الحديث.

وە هەریەك لە النسائي و ابن سعد دەڵێن : منكر الحديث.

وە الجوزجاني وە ابن عدي دەڵێن : ضعيف .

تەنیا ابن معين دەڵێ : ثقة .



وە لە سنن ابن ماجە بەژمارە ١٨٠٨ كِتَابُ الزَّكَاةِ. ا بَابٌ : مَا جَاءَ فِي عُمَّالِ الصَّدَقَةِ. هاتووە بەهەمان سەنەد ، وە لەوێشدا ئەلبانی دەڵێ : حسن

وە أبو داود بەهەمان سەنەد لە سعد بن سنان هێناویەتی.









# كتاب الصَّوْمِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فــەرموودەی : ١٧

بَابٌ : إِفْطَارِ الصَّائِمِ الْمُتَطَوِّعِ . :

**عن أم هانئ قالت : كنت قاعدة عند النبي صلى الله عليه وسلم، فأتي بشراب، فشرب منه، ثم ناولني، فشربت منه، فقلت : إني أذنبت فاستغفر لي. فقال : " وما ذاك ؟ ". قالت : كنت صائمة، فأفطرت. فقال : " أمن قضاء كنت تقضينه ؟ ". قالت : لا. قال : " فلا يضرك ."**

ئەلبانی و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح

الترمذي دەڵێت : وحديث أم هانئ في إسناده مقال. سنن ٧٣٢

واته تصحيحي نەكردیه .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە [ ابن ام هانيء ] تێدایە .مجهوله.

بۆیە ئیمامی الترمذي دەڵێ لەسەنەدی قسە هەیە .






# كتاب الْحَجِّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ١٨

بَابٌ : دُخُولُ النَّبِيِّ مَكَّةَ نَهَارًا .

٨٥٤ حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى ، قَالَ : حَدَّثَنَا وَكِيعٌ ، قَالَ : حَدَّثَنَا الْعُمَرِيُّ ، عَنْ نَافِعٍ ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ مَكَّةَ نَهَارًا‌ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح

الترمذي دەڵێت : هذا حديث حسن.

دەڵێم : لە ڕووی سەنەدەوە ( عبدالله بن عمر بن عاصم ،العمري

فيه مقال ، هەریەك لە :

يحيى بن سعيد القطان و علي ابن المديني و البخاري و أبوزرعة الرازي و أبو حاتم الرازي و النسائي و الدارقطني دەڵێن : ضعيف.



وه يحيى بن معين وه احمد بن حنبل : له ڕیوایەتێک دەڵێن : صالح وه له یەکی تر دەڵێن : ضعيف .

دەڵێم: هەريەك له ابن ماجه له سنن به ژماره ٢٩٤١ وه احمد له مسند بەژماره ٥٢٣٠ بەهەمان سەنەد هێناویانه واته له (العمري ) لەسەرەوە قسه مان لەسەری کرد

کەواته تەنـانەت ڕێگاکانی تری که لێوەی هاتوون له كتب التسعة ضعيفن .









# كتاب الْجَنَائِزِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ١٩

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الْقِرَاءَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ .

مەتنی فەرموودە : **عن ابن عباس ، أن النبي صلى الله عليه وسلم قرأ على الجنازة بفاتحة الكتاب .**

الألباني و محمد و شاكر دەڵێن : صحيح .

الترمذي دەڵێت : حديث ابن عباس حديث ليس إسناده بذاك القوي. إبراهيم بن عثمان هو : أبو شيبة الواسطي، منكر الحديث.

واتە بەلاوازی داناوە بەهۆی ( إبراهيم بن عثمان ) دەڵێ : منكر الحديث .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( إبراهيم بن عثمان ،أبو شيبة الواسطي ) تێدایە ضعيفة سەلەف بەو شێوە جرحیان کردیە :



شعبة بن الحجاج دەڵێ : ضعيف ومذموم .

وە هەریەك لە البخاري و أبو حاتم الرازي دەڵێن : سكتوا عنه .

وە يحيى بن معين وە احمد بن حنبل وە أبو زرعة الرازي وە أبو داود و ابن عدي و ابن حبان دەڵێن : ضعيف .

والنسائي دەڵێ : متروك .وە الترمذي دەڵێ : منكر الحديث.

وە لە متأخرينيش بەلاوازيان داناوە .





## فەرموودەی : ٢٠

بَابٌ : تَرْكُ الصَّلَاةِ عَلَى الْجَنِينِ حَتَّى يَسْتَهِلَّ .

مەتنی فەرموودە : **عن جابر ، عن النبي صلى الله عليه وسلم، قال : " الطفل لا يصلى عليه، ولا يرث، ولا يورث حتى يستهل ."**

ئەلباني و محمد بن صبحي و ئەتباعیان دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : هذا حديث قد اضطرب الناس فيه .

واته به مضطرب ی داناوه لەڕووی سەنەدەوە .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە دوو عیللەی تێدایە :

یەکەمیان : ( إسماعيل بن مسلم المكي ) ضعيف

عمرو بن علي الفلاس دەڵێ : يحيى بن سعيد و ابن مهدي

فەرموودیان لێوە ڕیوایەت نەدەکرد .

يحيى بن معين وە أبو زرعة الرازي وە أبو حاتم الرازي وە العقيلي دەڵێن : ضعيف .



وە ئەحمەد بن حەنبەل دەڵێ : منكر الحديث.

وە احمد بن شعيب النسائي وە الدارقطني دەڵێن :متروك .

دووەمیان : ( أبو زبير المكي . محمد بن مسلم)

فيه مقال وە مدلس ، ئەو ڕیوایەتەش معنعنه .

قال الكردي : ئەم فەرمووده بەڕێگای تر هاتووه لە سنن ابن ماجه والدارمي بەڵام سەنەدیان لاوازه بەهەمان عیللەی سەرەوە .



## فەرموودەی : ٢١

بَابٌ : مَا يَقُولُ إِذَا أُدْخِلَ الْمَيِّتُ الْقَبْرَ .

مەتنی فەرموودە :

**عن ابن عمر ، أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا أدخل الميت القبر، وقال أبو خالد مرة : إذا وضع الميت في لحده. قال مرة : " باسم الله، وبالله، وعلى ملة رسول الله ". وقال مرة : " باسم الله، وبالله، وعلى سنة رسول الله صلى الله عليه وسلم.**

ئەلباني و محمد بن صبحي و معاصرين دەڵێن : صحيح .

الترمذي دەڵێت : هذا حديث حسن غريب من هذا الوجه.

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( الحجاج بن أرطأت بن ثور ) فيه مقال.

ابن حبان لە المجروحين دەڵێت : تركه ابن المبارك ويحيى القطان و وعبدالرحمن بن مهدي و يحيى بن معين و احمد بن حنبل .

وە النسائي و الدارقطني دەڵێن : ضعيف .



وه أبو حاتم الرازي دەڵێت : لايحتج بحديثه .

وه جگه لەوەش( مدلسه)

هەريەك له  علي ابن المديني و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي

وه النسائي و الدارقطني و ابن حبان دەڵێن : يدلس و يرسل ...

وه ئەو ڕيوايەتەش ( معنعنه ) .

واته ضعيفة و مدلسه و ڕيوايەتەكەش به عن نەك حدثنا .





## فەرموودەی : ٢٢

بَابٌ : مَا جَاءَ فِيمَنْ مَاتَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ .

مەتنی فەرموودە:

**قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " ما من مسلم يموت يوم الجمعة، أو ليلة الجمعة إلا وقاه الله فتنة القبر ."**

الألباني و محمد بن صبحي دەڵێن : حسن .

الترمذي دەڵێ : هذا حديث غريب. واتە هەم لەڕووی مەتن وە هەمیش لە ڕووی سەنەدەوە .

وەدڵێ : وهذا حديث ليس إسناده بمتصل ؛ واتە سەنەدی پچڕانی تێدایە .

وەدەڵێت : ولا نعرف لربيعة بن سيف سماعا من عبد الله بن عمرو.

دەڵێم : ووردترین تەحقیقی بۆی کردووە ، دەڵێ پچڕانی تێدایە هۆکارەکەشی ڕوونکردۆتەوە کەوا ( ربيعة )گوێی لە ( عبدالله) نەبوە .



قال الكردي :

ئەو سەنەدە دوو عیللەی تێدایە :

یەکەمیان : ( هشام بن سعد المدني ) تـ ١٥٩ -١٦٠ فيه مقال .

احمد بن حنبل وە يحيى بن معين دەڵێن : يحيى القطان ڕیوایەتی لێوە نەدەکرد واتە ترکی کردبوو،

وە أبو حاتم الرازي دەڵێ : لايحتج بحديثه والنسائي دەڵێ ضعيف.

دووەمیان : ( ربيعة بن سيف ) تـ ١٢٠

ئیمامی البخاري لە الأوسط دەڵێ : روى أحاديث لايتابع عليها،

وە دەڵێ : عنده مناكير .

وە النسائئ لە سنن دەڵێ : ضعيف.

وە ابن حبان لە الثقات دەڵێ : يخطيء كثيرا.

والدارقطني دەڵێ : صالح ، ئەمەش واتای تعديل کردنی نیە .

وە أبو عيسى الترمذي دەڵێت : ربيعة گوێی لە عبدالله بن عمرو نەبووە ، واتە منقطعة . والله أعلم .






# كتاب النِّكَاحِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ٢٣

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ وَعِنْدَهُ أُخْتَانِ .

مەتنی فەرموودە:

**حدثنا قتيبة ، قال : حدثنا ابن لهيعة ، عن أبي وهب الجيشاني ، أنه سمع ابن فيروز الديلمي ، يحدث عن أبيه ، قال : أتيت النبي صلى الله عليه وسلم، فقلت : يا رسول الله، إني أسلمت وتحتي أختان. فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " اختر أيتهما شئت ."**

الألباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : حسن.

الترمذي بێدەنگ بووە لێی .

دەڵێم: لەڕووی سەنەدەوە سێ عیللەی تێدایە :



یەکەمیان: (ابن لهيعة ) ی تێدایە کەوا سەلەف و متأخرين متفق بوون لەسەر تضعیف کردنی.

(أبي وهب الجيشاني المصري ) تێدایە دووەمیان :

ئیمامی البخاري دەڵێت : في اسناده نظر .

وە لە متأخرین : ابن القطان الفاسي دەڵێت : مجهول .

(الضحاك بن فيروز الديلمي ) سێیەمیان:

ئیمامی البخاري لە التأريخ الكبير دەڵێ : لايعرف سماع بعضهم من بعض .وە لە متأخرین : ابن القطان الفاسي دەڵێت : مجهول .

تێبینی: لە ڕیوایەتی ( ١١٣٠) ئیمامی الترمذي هێناویەتی لە ڕێگای

(يحيى بن أيوب عن يزيد بن حبيب عن ابي وهب عن الديلمي)

رجالەکان هەمووی ثقەن جگە لە أبي وهب وە الديلمي))

لەسەرەوە قسەمان لەسەریان کرد .








# كتاب الرَّضَاعِ عَنِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ٢٤

مەتنی فەرموودە:

**عن جابر ، عن النبي صلى الله عليه وسلم، قال : " لا تلجوا على المغيبات ؛ فإن الشيطان يجري من أحدكم مجرى الدم ". قلنا : ومنك ؟ قال : " ومني، ولكن الله أعانني عليه فأسلم ".**

ئەلباني و محمد بن صبحي هتد دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : هذا حديث غريب من هذا الوجه. واته ضعيف.

دواتر ڕوونی دەكاتەوە دەڵێ : وقد تكلم بعضهم في مجالد بن سعيد من قبل حفظه.



دەڵێم : مجالد بن سعيد بن عمير الهمداني (تـــ ١٤٤ هــــــ)

پێشەوایانی سەلەف قسەیان لەسەر کردووە بەو شێوە :

البخاري لە ( الضعفاء ) دەڵێ : يحيى بن سعيد بە ضعيفي دادەنا، وە علي ابن المديني و الفلاس بەهەمان شێوە لە يحيى بن سعيد تضعيفي نەقڵ دەكەن .

وە يحيى بن معين جارێک دەڵێ : لايحتج به وە دەڵێ ضعيف وە دەڵێ ثقة .

وە احمد بن حنبل وە ابن سعد وە ابو حاتم و أبو زرعة الرازي وەالنسائي و ابن عدي وە الدارقطني وە الجوزجاني . جرحيان كردوە .









# كتاب الطَّلَاقِ وَاللِّعَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ٢٥

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الْجِدِّ وَالْهَزْلِ فِي الطَّلَاقِ .

مەتنی فەرموودە:

**عن أبي هريرة ، قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " ثلاث جدهن جد، وهزلهن جد : النكاح، والطلاق، والرجعة ".**

الألباني و محمد بن صبحي دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : حديث حسن غريب.

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ڕیوایەتەکان دەچێتەوە سەر (عبدالرحمان بن حبيب بن ادرک المدني) ضعيف .

يحيى بن معين دەڵێت : ضعيف .



وه علي ابن المديني وه النسائي دەڵێن: منكر الحديث .

وەتەنانەت لە متأخرين الذهبي وابن حجر دەڵێن : لين .





## فەرموودەی:٢٦

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الْمُخْتَلِعَاتِ

مەتنی فەرموودەکە :

**حدثنا أبو كريب ، قال : حدثنا مزاحم بن ذواد بن علبة ، عن أبيه ، عن ليث ، عن أبي الخطاب ، عن أبي زرعة ، عن أبي إدريس ، عن ثوبان ، عن النبي صلى الله عليه وسلم، قال : " المختلعات هن المنافقات ".**

ئەلباني و محمد و شاكر دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : هذا حديث غريب من هذا الوجه. وليس إسناده بالقوي. تضعيفي دەكات وە دەڵێ سەنەدی بێهێزە .

قال الكردي :

ئەو سەنەدە پێنج عیللەی تێدایە بریتین لە :

یەکەمییان: (مزاحم بن ذواد بن علبة الكوفي )

أبو حاتم الرازي دەڵێت : يكتب ولايحتج بحديثه.



دووەمیان :( ذواد بن علبة الكوفي )

پێشەوایانی سەلەف جرحیان کردووە ئەوانیش :

يحيى بن معين وە محمد بن إسماعيل البخاري وە أبو حاتم الرازي

وە أبو زرعة الرازي وە النسائي و ابن عدي الجرجاني وە أبو الحسن الدارقطني دەڵێن : ضعيف .

ابن حبان لە المجروحين دەڵێ : منكر الحديث جدا.

سێیەمیان: (ليث بن أبي سليم القرشي )( تـ ١٤٨ هـ ) . ضعيفة.

هەریەک لە : يحيى بن سعيد القطان و يحيى بن معين و احمد بن حنبل أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و النسائي و الجوزجاني و ابن حبان و الدارقطني دەڵێن : ضعيف

چوارەمیان : (أبي الخطاب ) مجهولە .

أبو حاتم الرازي دەڵێت : مجهول .

أبو زرعة الرازي دەڵێ : لا أعرفه .

پێنجەمیان : (أبي زرعة ) مجهول.

أبو حاتم الرازي دەڵێ : مجهول .



وە لە متأخرين ابن حجر لە التقريب دەڵێ : مجهول .

سبحان الله سەنەدێک بەو شێوە بێت چۆن و بەچ شێوەیەك حەقی تصحيح كردني پێدەدەی!!!

ئەوە مخالەفات نەبێ چیە ؟









# كتاب: الْبُيُوعُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

## بَابٌ : مَا جَاءَ فِي التَّبْكِيرِ بِالتِّجَارَةِ .



### فەرموودەی ٢٧

حدثنا يعقوب بن إبراهيم الدورقي ، قال : حدثنا هشيم ، قال : حدثنا يعلى بن عطاء ، عن عمارة بن حديد ، عن صخر الغامدي ، قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " اللهم بارك لأمتي في بكورها ". قال : وكان إذا بعث سرية، أو جيشا بعثهم أول النهار، وكان صخر رجلا تاجرا، وكان إذا بعث تجارة بعثهم أول النهار، فأثرى، وكثر ماله.

ئەلباني و محمد بن صبحي و هتد دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : حديث صخر الغامدي حديث حسن، ولا نعرف لصخر الغامدي عن النبي صلى الله عليه وسلم غير هذا الحديث.



دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( عمارة بن حديد البجلي الكوفي)

پێشەوایانی سەلەف بە مجهولیان داناوە وەك :

أحمد بن حنبل وە أبو حاتم الرازي دەڵێت : مجهول .

أبو زرعة الرازي دەڵێت : لايعرف .

وە لە متأخرين الذهبي لە ( الكاشف ) دەڵێ : لايدري من هو ؟.

وە ابن حجر لە تقريب التهذيب دەڵێت : مجهول .





## فەرموودەی : ٢٨

**أخبرنا أبو كريب ، قال : أخبرنا وكيع ، عن حماد بن سلمة ، عن أبي المهزم ، عن أبي هريرة ، قال : نهى عن ثمن الكلب، إلا كلب الصيد .**

ئەلباني دەڵێت : حسن.

الترمذي دەڵێت : هذا حديث لا يصح من هذا الوجه .

واتە لەو ڕووەوە لەڕوی سەنەدەوە لاوازە ، وە دەڵێ :وأبو المهزم اسمه : يزيد بن سفيان. وتكلم فيه شعبة بن الحجاج، وضعفه.

دەڵێم : ( أبو المهزم التميمي البصري ) ضعيف.

هەريەك لە شعبة بن الحجاج وە يحيى بن معين وە أحمد بن حنبل وە أبو حاتم الرازي وە أبو زرعة الرازي وە الترمذي دەڵێن:ضعيف.

وە النسائي و الدارقطني دەڵێن : متروك .



ئەو فەرموودەی بەڕیوایەتی تر هاتووە لە سنن أبي داود و النسائي و الدارمي و احمد کەوا حسنن بەڵام ئەم سەنەدە لاوازە.








# كتابُ الْأَحْكَامِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی ٢٩

قلت لقتيبة بن سعيد حدثكم محمد بن يحيى بن قيس المأربي ، قال : حدثني أبي ، عن ثمامة بن شراحيل ، عن سمي بن قيس ، عن شمير ، عن أبيض بن حمال ، أنه وفد إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فاستقطعه الملح فقطع له، فلما أن ولى قال رجل من المجلس : أتدري ما قطعت له ؟ إنما قطعت له الماء العد ، قال : فانتزعه منه، قال : وسأله عما يحمى من الأراك. قال : ما لم تنله خفاف الإبل، فأقر به قتيبة، وقال : نعم.

ئەلباني دەڵێت : حسن.

الترمذي دەڵێت :حديث أبيض حديث غريب، واتە ضعيف.

دەڵێم: لەڕووی سەنەدەوە دوو عیللەی تێدایە ئەوانیش :



یەکەمیان : (سمي بن قيس اليماني ) تێدایە مجهولە.

دووەمیان : وە ( شمير ) ی تێدایە کەوا : شبهـ مجهول.









# كتاب الدِّيَاتُ عَنْ رَسُولِ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : .



## فەرموودەی : ٣٠

نەصي فەرموودە:

**حدثنا الحسين بن حريث ، قال : حدثنا الفضل بن موسى ، عن الحسين بن واقد ، عن يزيد الرقاشي ، قال : حدثنا أبو الحكم البجلي ، قال : سمعت أبا سعيد الخدري ، وأبا هريرة يذكران عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : " لو أن أهل السماء، والأرض اشتركوا في دم مؤمن لأكبهم الله في النار ".**

الألباني وە محمد بن صبحي دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : هذا حديث غريب . واتە لاوازە هەم لەڕووی مەتن وە هەم لەڕووی سەنەدەوە .



دەڵێم : ئەو سەنەدە دوو عیللەی تێدایە :

( يزيد بن أبان الرقاشي ) البصري (تــ ١٢٠ هــ ) ضعيفة یەکەمیان :

پێشەوایانی سەلەف بە لاوازیان داناوە لەوانیش هەریەك لە :

شعبة بن الحجاج و يحيى بن سعيد القطان و يحيى بن معين و احمد بن حنبل و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و ابن حبان والدارقطني دەڵێن: ضعيف.

و أبو عبدالرحمن النسائي دەڵێت : متروك .

(أبو الحكم البجلي ) تێدایە مجهولە. دووەمیان :





## فەرموودەکانی : ٣٢-٣١-٣٠

بَابٌ : مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَقْتُلُ ابْنَهُ يُقَادُ مِنْهُ أَمْ لَا ؟

سەنەدی فەرموودە:

**(حدثنا أبو سعيد الأشج ، قال : حدثنا أبو خالد الأحمر ، عن الحجاج بن أرطاة ، عن عمرو بن شعيب ، عن أبيه ، عن جده ، عن عمر بن الخطاب ، قال : سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : " لا يقاد الوالد بالولد ."**

ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح .

الترمذي : لێی بێدەنگ بووە بەڵام لە فەرموودەی ١٣٩٩ وە ١٤٠١

تضعيفي هەموو ڕیوایەتەکان دەکات و دەڵێت :

وهذا حديث فيه اضطراب .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە : ( حجاج بن الأرطأة ) تێدایە

فيه مقال پێشووتر قسەمان لەسەری کردووە وە لاوازە .

وە ڕیوایەتی ( عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده ) فيه مقال.



وە بەهەمان شێوە لە ڕیوایەتی ١٤٠١ کەوا ئەلباني تصحیحي کردیە دەڵێت :

هذا حديث لا نعرفه بهذا الإسناد مرفوعا إلا من حديث إسماعيل بن مسلم، وإسماعيل بن مسلم المكي، قد تكلم فيه بعض أهل العلم من قبل حفظه.

واتە بەلاوازی داناوە بەهۆی : ( إسماعيل بن مسلم المكي )

النسائي والدارقطني دەڵێن : متروك .

وە کۆدەنگی پێشەوایانی الجرح والتعديل لە سەلەف لەسەریەتی لە بەلاواز دانانی .








# كتابُ الْحُدُودِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ٣٤

بَابٌ : مَا جَاءَ أَنْ لَا تُقْطَعُ الْأَيْدِي فِي الْغَزْوِ .

سەنەد و مەتنی حدیث:

**(حدثنا قتيبة ، قال : حدثنا ابن لهيعة ، عن عياش بن عباس المصري ، عن شييم بن بيتان ، عن جنادة بن أبي أمية ، عن بسر بن أرطاة ، قال : سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول : " لا تقطع الأيدي في الغزو."**

ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح .

الترمذي دەڵێت : هذا حديث غريب .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( عبدالله بن لهيعة ) ی تێدایە.

کەوا ضعيفة لای زۆرینەی پێشەوایانی الجرح والتعديل له سەلەف .



## فەرموودەی : ٣٥

**حدثنا قتيبة بن سعيد ، حدثنا يعقوب - يعني الإسكندراني - عن عمرو ، عن المطلب ، عن جابر بن عبد الله ، قال : شهدت مع النبي صلى الله عليه وسلم الأضحى بالمصلى، فلما قضى خطبته نزل عن منبره، فأتي بكبش، فذبحه رسول الله صلى الله عليه وسلم بيده، وقال : " باسم الله، والله أكبر، هذا عني، وعمن لم يضح من أمتي ."**

ئەلباني و محمد بن صبحي دەڵێن : صحيح.

الترمذي دەڵێت : هذا حديث غريب من هذا الوجه .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە دوو عیللەی تێدایە .

( عمر بن أبي عمرو ميسرة )( تـ ١٥٠ هـ ) یەکەمیان:

فيه مقال . وثقه بعض و ضعفه بعض بەم شێوەیە :

يحيى بن معين وە النسائي وە الجوزجاني والدارقطني جرحيان کردووە .

احمد بن حنبل وە أبو حاتم الرازي وە أبوزرعة الرازي تعديليان کردووە .



( المطلب بن عبدالله بن حنطب )دووەمیان :

گوێی له جابر نەبووە .

ئیمام الترمذي دەڵێت : والمطلب بن عبد الله بن حنطب، يقال إنه لم يسمع من جابر. واتە دەڵێن گوێی لێنەبووە.

أبو حاتم الرازي له ( المراسيل ) دەڵێ : لم يسمع من جابر .

واتە (منقطعة ) پچڕان لەسەنەدی هەیە والله أعلم .





أَبْوَابُ النُّذُورِ وَالأَيْمَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## فەرموودەکـانی : ٣٦-٣٧

بَابٌ : مَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ أَنْ لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ .

فەرموودەکە : (**حدثنا قتيبة ، قال : حدثنا أبو صفوان ، قال : عن يونس بن يزيد ، عن ابن شهاب ، عن أبي سلمة ، عن عائشة ، قالت : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " لا نذر في معصية، وكفارته كفارة يمين ".**

ئەلباني دەڵێت : صحيح .

الترمذي دەڵێت : هذا حديث لا يصح ؛ واتە ئەو ڕیوایەتە صحيح نیە بۆ چی چونکە دەڵێت: ؟

لأن الزهري لم يسمع هذا الحديث من أبي سلمة، سمعت محمدا يقول : روى غير واحد منهم : موسى بن عقبة، وابن أبي عتيق، عن الزهري، عن سليمان بن أرقم، عن يحيى بن أبي كثير، عن أبي سلمة، عن عائشة، عن النبي صلى الله عليه وسلم، قال محمد : والحديث هو هذا.



ابن شهاب ئەو فەرموودەیی له أبي سلمة گویٚ لێنەبووه ،

وەگوێم لە( محمد واته البخاري ) بوو دەیگووت ، کۆمەڵێک ئەو فەرموودەیان ڕیوایەت کردووه لەوانیش :موسى بن عقبة

وابن أبي عتيق له الزهري له سليمان بن الأرقم له يحى بن أبي كثير له سلمة

دەڵێم:

لەڕووی سەنەدەوه رجالەکان هەمووی ثقة ن بەڵام وەك ئیمامی الترمذي عیللەی سەنەدەکەی دۆزیەوه کەوا ئەصل( ابن شهاب عن سليمان بن الأرقم ) ه

دواتر لەفەرموودەی دواتر واته ژماره ١٥٢٥ سەنەدەکه بەو شێوه دەهێنێت حدثنا أبو إسماعيل الترمذي : محمد بن إسماعيل بن يوسف ، قال : حدثنا: أيوب بن سليمان بن بلال ، قال : حدثنا أبو بكر بن أبي أويس ، عن سليمان بن بلال ، عن موسى بن عقبة ، ومحمد بن عبد الله بن أبي عتيق ، عن الزهري ، عن سليمان بن أرقم ، عن يحيى بن أبي كثير ، عن أبي سلمة ، عن عائشة ، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال : " لا نذر في معصية الله، وكفارته كفارة يمين ".

واته هەمان مەتن بەڵام بەسەنەدی جیاواز .

ئینجا دەڵێت : هذا حديث غريب، وهو أصح من حديث أبي صفوان عن يونس . واته ضعيف.



دەڵێم : ( سليمان بن أرقم ) متروك ه .

پێشەوایانی سەلەف بەو شێوە قسەیان لەسەر کردووە:

ئیمامی البخاري دەڵێت : تركوه .

أبو حاتم الرازي والنسائي و أبو داود والترمذي و الدارقطني دەڵێن : متروك .

وە يحيى بن معين وە احمد بن حنبل دەڵێن : ليس بشيء .

وە عمرو الفلاس وە مسلم دەڵێن : منكر الحديث .

واتە بەتوندی جرح کراوە و متروكە ، بۆیە دەبینین ئیمامی الترمذي لەژێر ئەو سەنەدە دەڵێ : غريب . چونکە دەزانێت سليمان بن أرقم ، متروکە والله اعلم .









# كتاب السِّيَرِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



## فەرموودەی : ٣٨

بَابٌ : كَرَاهِيَةُ بَيْعِ الْمَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ

**حدثنا هناد ، قال : حدثنا حاتم بن إسماعيل ، عن جهضم بن عبد الله ، عن محمد بن إبراهيم ، عن محمد بن زيد ، عن شهر بن حوشب ، عن أبي سعيد الخدري ، قال : نهى رسول الله صلى الله عليه وسلم، عن شراء المغانم حتى تقسم.**

ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن: صحيح.

الترمذي دەڵێت : وهذا حديث غريب. واتە لەڕووی مەتن و سەنەدەوە .

دەڵێم ئەو سەنەدە سێ عیللەی تێدایە :

یەکەمیان: (محمد بن إبراهيم الباهلي البصري ) مجهول



أبو حاتم الرازي دەڵێت : مجهول .

دووەمیان: (محمد بن زيد العبدي ) فيه مقال قال الدارقطني ليس بالقوي، وە شبهەی مجهولی لەسەرە

سێیەمیان :(شهر بن حوشب ) فيه مقال





## فەرموودەی : ٣٩

**حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ ، عَنْ قَتَادَةَ ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ، عَنْ ثَوْبَانَ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنْ مَاتَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلَاثٍ : الْكِبْرِ، وَالْغُلُولِ، وَالدَّيْنِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ ."**

ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح.

الترمذي : لێی بێدەنگ بووە ، بەڵام لەڕیوایەتی ١٥٧٣ واتە ڕیوایەتێك دوای ئەوە دەڵێت : هَكَذَا قَالَ سَعِيدٌ : الْكَنْزُ. وَقَالَ أَبُو عَوَانَةَ فِي حَدِيثِهِ : الْكِبْرُ. وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ مَعْدَانَ. وَرِوَايَةُ سَعِيدٍ أَصَحُّ. ڕیوایەتی سعيد عن قتادة عن سالم عن معدان بن أبي طلحة عن عن ثوبان ) ڕاسترە لە ڕیوایەتی أبو عوانة واتە فەرموودەی ژمارە ١٥٧٢ ، بەڵام ، ئەو ڕیوایەتەی ئیمامی الترمذي هەڵی بژاردووە مەتنی (شاذة)

دەڵێم : ئەو فەرموودە لەڕووی سەنەدەوە ( منقطعة ) چونکە

(سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ) گوێی لە ( ثوبان ) نەبووە ،



هەريەك لە پێشەوايانی وەك ( يحيى بن معين و أبو حاتم الرازي و أحمد بن حنبل ) هەموويان دەڵێن : لم يسمع من ثوبان .

ئيمامی ئەحمەد بن حەنبەل تەفاسيلی پێدەدا و دەڵێ :

(وليست هذه الأحاديث بصحاح ) واتە هەموو ئەو ڕيوايەتانەی لەو بارەوە هاتوون ( تضعيف ) دەكات ، كەواتە جگە لەوەی مخالەفەی سەلەف لە سەنەد حوكميان داوە لە ناوەڕۆكيش بەهەمان شێوە كەوا عيللەيە.





## فەرموودەی : ٤٠

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ ، قَالَ : حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ، قَالَ : قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَمُرُّ بِقَوْمٍ فَلاَ هُمْ يُضَيِّفُونَا، وَلَا هُمْ يُؤَدُّونَ مَا لَنَا عَلَيْهِمْ مِنَ الْحَقِّ، وَلَا نَحْنُ نَأْخُذُ مِنْهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنْ أَبَوْا إِلَّا أَنْ تَأْخُذُوا كَرْهًا فَخُذُوا ."

ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح.

ئیمامی الترمذي دەڵێت : حسن .

دەڵێم : لەڕووی سەنەدەوە ( ابن لهيعة ) ی تێدایە کەوا کۆدەنگی هەیە لەسەر تضعيف کردنی لەسەلەف و خەلەف ، بەڵام، لەڕووی مەتنەوە (صحيحة ) چونکە بەڕێگای تر ئیمامی البخاري و مسلم هێناویانە ، بەڵام ، وەك ڕوونە لێرەدا ئەگەر بەڕێگای تریش هاتووە کەوا صحيحە پێویستە بڵێن : ئەوسەنەدە بەو شێوە لاوازە ، چونکە ئەگەر وابێ ناتوانین بە هیچ فەرموودەیەك بڵێین ( ضعيف)

کەواتە لێرەدا هیچ بەهایەك بۆ سەنەد نامێنێتەوە.



## فەرموودەکـانی : ٤١-٤٢

حَدَّثَنَا هَنَّادٌ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ سَرِيَّةً إِلَى خَثْعَمٍ فَاعْتَصَمَ نَاسٌ بِالسُّجُودِ، فَأَسْرَعَ فِيهِمُ الْقَتْلُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَ لَهُمْ بِنِصْفِ الْعَقْلِ ، وَقَالَ : " أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ ". قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلِمَ. قَالَ : " لَا تَرَاءَى نَارَاهُمَا ."

ئەلباني و محمد بن صبحي و شاكر دەڵێن : صحيح .

ئیمامی الترمذي : لێی بێدەنگ بووە بەڵام لە ڕیوایەتی ١٦٠٥ دەڵێت : وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ جَرِيرٍ وَهَذَا أَصَحُّ. واتە : تضعيفي ڕیوایەتی یەکەم دەکات ،

سبحان الله ئەوە ئەو پەڕی ووردی و اتقانی ئەو پێشەوایانە ، چۆن و بەچ شێوەیەك ڕیوایەتی معلول دیاری دەکەن ، دواتر ئیمامی الترمذي : ڕوونتری دەکاتەوە و دەڵێت :



وَأَكْثَرُ أَصْحَابِ إِسْمَاعِيلَ، قَالُوا : عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بَعَثَ سَرِيَّةً، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ جَرِيرٍ.

واته زۆرینەی قوتابیەکانی ئیسماعیل دەڵێن (عن قیس ) ئینجا ڕاستەوخۆ له رسول الله وه واته ( مرسل) .

وەدەڵێت :وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ : الصَّحِيحُ حَدِيثُ قَيْسٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ.

گوێم له محمد بن ئیسماعیل واته ( البخاري ) بوو دەیگووت :

ڕاستی ئەو ڕیوایەته قَيْسٍ عَنِ النَّبِيِّ مرسله .

قال الكردي : بۆ ئەوەی ڕوون بێت لای خوێنەر ، ئەو ڕیوایەته لەسەرەتادا سەنەدی( متصل ) ە وه رجالەکانی ثقة ن بەڵام عیللەیەکی خەففی له سەنەدی هەیه ئەویش ئەوەیه زۆرینەی تری هاوەڵانی ئیسماعیل که ئەو ڕیوایەتەیان هێناوه له ئیسماعیل به (مرسل ) هێناویانه نەك ( متصل ) بۆیه دەبینین لێرەدا دوو جیبالی علم ئەوانیش ( البخاري و الترمذي ) ئەو عیللەی سەنەدیان دیاری کردووه ، هەروەها ئەو فەرمووده ئیمامی ئەبوداود له سنن هێناویەتی بەژماره ٢٦٤٥ له کتابی الجهاد دا دواتر دەڵێت :

قَالَ أَبُو دَاوُدَ : رَوَاهُ هُشَيْمٌ، وَمَعْمَرٌ، وَخَالِدٌ الْوَاسِطِيُّ، وَجَمَاعَةٌ، لَمْ يَذْكُرُوا جَرِيرًا.



واتـە : مەبەستی ئەبو داود لێرەدا ئەوەیە هُشَیْمٌ، وَمَعْمَرٌ، وَخَالِدٌ الْوَاسِطِيُّ کە لە ئیسماعیل ڕیوایەتیان کردووە بێ جریر بووە واتە بەمرسلی هێناویانە ،

هەروەها ئیمامی النسائي لە سنن هێناویەتی بەژمارە ٤٧٨٠

بەو شێوە : أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلَاءِ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ ، عَنْ قَيْسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاوشێوەی الترمذي و أبو داود ...

واتە ئیمامی النسائي ڕاستەو خۆ بە ( مرسل ) هێناویەتی لە قیس لە پێغەمبەرەوە ، ئەمەش اتقان و ووردی ئەو پێشەوایانەی سەلەفمان بۆ دەردەخات .

بۆ ئەوەی لە هۆکاری عیللەی سەنەدی تێبگەن :

ئەو فەرموودە کەوا تصحیح کراوە لە لایەن هەندێک لە معاصرین و تضعیفیش کراوە لای پێشەوایانی سەلەف هۆکارەکەی ئەوەیە:

ئەو فەرموودە تەنها ( أبو معاوية الضرير ) کە ناوی (محمد بن خازم التميمي)ە لە ساڵی ( ١١٣ لەدايك بووە و لە ١٩٥ ) وەفاتی کردووە ، بەمرفوعي هێناویەتی ،ئەو ڕاویە سەلەف متفق بوونە لەسەر ئەوەی کەوا یەکێکە لە( أثبت أصحاب الأعمش ) ە وەك ( شعبة بن الحجاج و يحيى القطان و يحيى بن معين و احمد بن حنبل و علي ابن المديني و ابن نمير و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و أبوداود و النسائي و الدارقطني و ابن حبان .. هتد ) هەموویان دەڵێن :

